له چاپكراوه‌كانی كۆڕی زانیاری كورد

# لیسته‌ی چواره‌می زاراوه‌كانی كۆڕ



له به‌شی یه‌كه‌می به‌رگی سێیه‌می
« گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد »
ده‌رهێنراوه

چاپخانه‌ی كۆڕی زانیاری كورد
به‌غدا ـ ١٩٧٥

# لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کوژ

موفرەداتی زمانی کوردی قاڵبۆوەی ساڵانی دوور و درێژی مێژوی گەلی کوردە و سوورە و تۆرەی چەندین پلەو قۆناخی هەڵس و کەوتی باری ژیانی هات و نەهاتێتی . لەو ماوە درێژ و بەرفرەوانەدا کە بە سرشت لە کەو دراون و کێژەکراون و کورکە و بنژیل و زێوانیـان لێ گیراون ، لە زۆر روی کرنـگەوە پتەوبوە و بە خۆدا هاتۆتەوە و دەوڵەمەند بوە .

بەش بە حاڵی زاراوی کوردی ، تا بڵێی بە رچە و رێـگایەکی ناهەمواری پێشکەوتندا تێپەڕیوە و هەمیشە لە کێشە و بەرەدا بوە . زاراو هەر لە زوەوە لە زمانی کوردیدا هەبوە ، بەڵام هیچی دەربارە نەنوسراوە و لێی نەکۆڵدراوەتەوە . تەنانەت سـەردەمانی زوو زمانی کوردی لێـکۆڵینەوەشی مەگەر بە دەگمەن تێدا کرابێ ، ئەگینا تا ماوەیەکی زۆریش هەندێ کەس لەوە بە گومان بوون کە زمانی کوردی زمانێـکی رەسەن و سەربەخۆیە .

مێژوی زاراو لە زمانی کوردیدا هەرگیز بێ پچڕان پەیوەستە و

پەیوەندە بە پێشکەوتنی زمانی کوردییەوە . بۆ ئەمە ئەگەر تەماشای کاری فەرهەنگ نوسنی کوردی بکەین ، ئەوە کێشەی زاراوی کوردی دەبینین . بە وێنە لە « نەوبەهار »ی ئەحمەدی خانی[1] و « ئەحمەدی » شێخ مارفی نۆدێی[2] و « الهدية الحميـــدية في اللغة الـكردية »ی یوسف ضیائەدین خالدی پاشا[3] و ..... دا گەلێك زاراوی وەهـا تۆمار کراون کە ئێستا سەرچاوەن و پەنایان بۆ دەبەین خۆ شێخ مارفی نۆدێی کە « پشتیر »ی بەرامبـــەر بە « اصطبل » و ؛ « شاگرد »ی بەرامبەر بە « تلمیـــذ » و ؛ « نەوە »ی بەرامبەر بە « حفید » و ؛ . . . هتد داناوە و نوسیوە و بەکار هێناوە ، ئەوە کێشەی زاراوی ئەو دەمەمان بۆ روَن دەکاتەوە .

یاخود لەم ســالانەی دواییدا کە مامۆستایان : گیو موکریانی و

(١) لە سالی ١٠٩٤ ك ـ ١٦٨٢ / ١٦٨٣ زدا شــاعیری مــەزنی کورد ئەحمەدی خانی لە ژێر ناوی « نەوبەهار »دا فەرهەنگۆکێکی بە شیعر بۆ یارمەتی مندالانی کورد لە فێربوونی زمانی عــەرەبیدا نوســیوە . دەستنوسی ئەم فەرهەنگۆکە چەند جارێك لە چاپ دراوە .

(٢) ســالی ١٢١٠ ك ـ ١٧٩٥ ز شــێخ مارفی نـۆدێی لە ژێر نــاوی « احمدی »دا بە شیعر فەرهەنگۆکێکی عەرەبی ـ کوردی دانــاوە . دەستنوسی ئەم فەرهەنگـۆکە هەر لە سالی ١٩٣٦دا دوو جار لە چاپ دراوە : یەك ـ لە سلێمانی ، دوو ـ لە بەغدا .

(٣) خالدي يوسف ضياءالدين باشا « الهدية الحميدية في اللغــة الـكردية » ، استانبول ١٨٩٣

مەردۆخ و شێخ محەمەدی خاڵ و تۆفیق وەهبی و قەناتی کوردۆ ..... هتد ، کە لە فەرهەنگەکانیاندا گەلێك زاراوی کوردییان تۆمار کردوە[٤] ، بەوەدا پێشکەوتن و گەشەکردنی زاراوی کوردیمان بۆ دەردەکەوێ .

بەداخەوە تا کو ئەمڕۆ لە زمانی کوردیـدا هیچ نوسراوێکی وەها نییە کە بە شێوەیەکی تیۆری رێڕەوێك بێت بۆ چۆنێتی دانان و وەرگێڕان و داڕشتنی زاراو ، بەڵام ئەگەر تەماشای مێژوی ئەم کارە بکەین ، ئەوە پێشکەوتن و گەشەکردنی ئەوەمان نیشان دەدەن کە لە ژیانی پراکتیکدا شارەزابون و پسپۆری پەیدا کردن بونەتە هۆی سەرکەوتنی .

تا ئەم سالانەی دوایش لە زمانی کوردیدا . جگە لە زاراوی رەسەنی کوردی ، زاراوی عەرەبی و فارسی و تورکی زۆر بەکار دەهێنران . بەڵام لەگەڵ پێشکەوتن و پەرەسەندنی ژیانی سیاسی و

(٤) بە وێنە مامۆستا گیو موکریانی « هەنـدەران »ی بۆ « خارجیة » و « شارەوانی » بۆ « بلدیة » داناوە . مامۆستا مەردۆخ « باژ »ی بۆ « جزء » و « رزد »ی بۆ « حریص » بەکار هێناوە . مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ « پەیجۆر »ی بۆ « تحقیق ( الشرطة ) » و « وەرزش »ی بۆ « ریاضة » تۆمار کردوە مامۆستا تۆفیق وەهبی « پار »ی بۆ « فصل ( الکتاب ) » و « دادخواز »ی بۆ « مشتکي » گوتووە . مامۆستا قەناتی کوردۆ « بەرەڤان »ی بۆ « حکم » و « فێرگە »ی بۆ « مدرسة » نوسیوە ... هتد .

ئابوری و زانستی . دا زاراو پەرەی سەند و پێویستی بەوە کرد کە گرنگی پێ بدرێ و لێی بکۆڵرێتەوە و وشەی جوان و راست و گونجاو و لەبار و رەسەنی کوردی بدۆزرێتەوە و دابنرێ و دابرێژرێ و دابتاشرێ .

لە ئەنجامی پێشکەوتنەدا پێویستمان بە گەلێ زاراوی کوردی بو . کاتێك کتێبەکانی فێرگەکان کران بە کوردی پێویستی وەرگێڕانی ئەو زاراوانە هاتە کایەوە . بەم جۆرە کاتێك خوێندن بو بە کوردی گەلێك زاراوی زانستی دۆزرانەوە و زیندو کرانەوە ، وە گەلێکی نوێ دارێژران . داتاشران ... جگە لەوە ئەم کارە لە سنوری قوتابخانە تێپەڕی و فراوانتر بو و ژمارەیەك مامۆستای دڵسۆز و هەندێ دەزگای کوردی و لیژنەی تایبەتی خۆیان بە دانانی فەرهەنگی زاراوەوە خەریك کرد(٥) .

---

(٥) سالی ١٩٦٠ لە گۆڤاری « رۆژی نوێ »دا ژمارەیەك زاراوی زانستی بلاوکراوەتەوە ، کە لە لایەن چەند لیژنەیەکی تایبەتی جیاوازەوە دانراون و دارێژراون . دوا بە دوای ئەم زاراوانە لە لایەن نەقابەی مامۆستایانی سلێمانییەوە فەرهەنگۆکێکی « زاراوی زانستی » دەرچو ، کە ٩٧ لاپەڕەیە . لە سالی ١٩٦٠دا مامۆستا جەمال نەبەز لە ژێر ناوی « هەندێك زاراوەی زانستی »دا فەرهەنگۆکێکی لە چاپدا ؛ وە لە سالی ١٩٦٠ – ١٩٦١یشدا بە رۆنیۆ سەد نوسخەیەکی لە ژێر ناوی « فەرهەنگۆکی زانستی »دا بلاوکردەوە . سالی ١٩٧١ لە لایەن لیژنەیەکی تایبەتیەوە فەرهەنگۆکێك . کە بریتییە لە کۆمەڵە وشە و =

کاتی رێکەوتنی یانزەی ئازاری مێژوویی رووی دا ، پێویستی وەرگێڕان و دانانی زاراوی کارگێڕی هاتە گۆڕێ و کۆڕی زانیاری کورد ئەو ئەرکە گرنگەی گرتە ئەستۆی خۆی . ئەنجومەنی کۆڕ بۆ بەجێهێنانی ئەم کارە بەشێکی زۆری ماوەی کۆبوونەوەکانی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کرد . ئەنجامی هەوڵ و تەقەلاش ، ئەوەیە کە تا ئەمڕۆ ژمارەیەکی باش لە زاراوی کارگێڕی تەواو کردوە و بڵاوکردۆتەوە[٦] .

= زاراوی عەرەبی ـ کوردی لە ژێر ناوی « فەرهەنگۆکی زاراوەی پارێزگای سلێمانی »دا لە چاپ درا بەژێوەبەرێتی گشتی خوێندنی کوردی لە ژمارە ( ٤ )ی ساڵی ١٩٧٢ و ژمارە ( ٧ ، ٨ )ی ساڵی ١٩٧٤ی گۆڤارەکەیدا ـ « پەروەردە و زانست » ـ ئەو زاراوانەی بۆ فێرگەکان پێویستن بلاوکردۆتەوە کۆڕی زانیاری کورد بە شێوەیەکی زانستی و فراوان گرنگی بەم مەسەلەیە داوە و چاکی مەردایەتی بە لارا کردوە ، وە رێبازێکی زانستی دیار کردوە بۆ ئەوەی لە سنووری توانادا بتوانێت بەرهەمێکی کامڵ بخاتە بەر دەست . تاکو ئێستا لە کۆڕی زانیاری کورد ژمارەیەکی زۆر لە زاراوی کوردی هەڵبژێرراون و داڕێژراون و بە سێ لیستەی گەورە و دوو کتێب بلاوکراونەتەوە . مامۆستا کەمال جەلال غەریب ساڵی ١٩٧٤ فەرهەنگێکی زاراوی زانستی عەرەبی ـ کوردی لە ژێر ناوی « فەرهەنگی زانیاری »دا بلاوکردەوە . . هتد .

(٦) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم . ل ٤١٩ ـ ٥٢٦ ؛ بەرگی دووەم . بەشی یەکەم ، ل ٨٩٤ ـ ٩٤١ ؛ بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، ل ١٦٦ ـ ٢١٨ =

جگە لەوە ئێستەش لەم ژمارەیەی گۆڤاری کۆڕدا بەشێکی دیکە لە زاراوی کارگێڕێ دەخەینە پێش چاو .

کۆڕ دانان و داتاشین و هەڵبژاردنی گشت جۆرە زاراوێك بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ ، بۆیەکا جگە لە زاراوی کارگێڕی بە کاری زاراوی کتێبی فێرگەکان و زمان ... یشەوە خەریکە . لە ژمارەی پێشوی گۆڤارەکەماندا هەندێ زاراوێ پزیشکێ[7] وکەمێ لە زارای زمانمان[8] بڵاوکردەوە . لەم ژمارەیەشدا تێکڕایی زاراوەکانی زمان و بەشێك لە زاراوی کتێبی فێرگەکان و هەندێ لە زاراوی کارگێڕی دەخەینە بەرچاو مامۆستایان و خوێنەرانی کوردێ دڵسۆز ، چونکە ئێمە دەزانین هیچ کارێك ، ئەویش کارێکی سەرەتایێ و تازە بێ کەم و کورتی نابێ و دوور نییە لە هەڵبژاردن و داڕشتنی ئەم زاراوانەدا توشی هەڵە بووبین . بۆیە تکا لە زانایان و ڕووناکبیرانی کورد دەکەین بیر و رای خۆیانمان بۆ دەربڕن ، رەخنەمان لێ بگرن ؟؟ ، یارمەتیمان

= هەروەها ئەو سێ لیستەیە بە دوو کتێبی سەربەخۆ چاپ کراون : « زاراوی کارگێڕێ » ــ دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ ، پێشەکێ و ڕێکخستنی د. کمال مەزهەر ، بەغدا ۱۹۷۳ ــ ۱۹۷٤ ؛ « زاراوی هەمەچەشنە » ــ دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشەکێ و ڕێکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجێ مارف ، بەغدا ۱۹۷٤ .

(۷) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، ل ۱۸۸ ــ ۲۱۸ .

(۸) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۸۵ ــ ۱۸۷

بدەن و دڵسۆزانە هەڵەکانمان بۆ راست بکەنەوە و ئەگەر زاراوی لەوانە جوانتر و رەسەنتر و لەبارتریان پێی شك دێ یا بەبیر دێتەوە بۆمانی بنێرن ، یا لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکاندا چاپی بکەن ، تا ئەوانیش خزمەتێکیان بە زمانی کوردی کردبێ و ئێمەش کەڵکمان لە زانیاری ئەوان وەرگرتبێ و جێی زاراوە ناڕاست و جێ نەگرتووەکانمان پڕ کردبێتەوە و لە ئەنجامدا کارە کە پوختتر و بە تازانجتر بێت .

بەم بۆنەیەوە زۆر بە گەرمی و پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو برا بەڕێزانە دەکەین کە دڵسۆزانە لە زاراوەکانی کۆڕیان کۆڵیوەتەوە و هیوامانە لەمەودواش هاریکاریمان لەگەڵ بکەن . ئێمەش هەمیشە گرنگیمان بە رایان داوە ، بە وێنە ئەنجومەنی کۆڕ بۆ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و بەراوردی کاری رەخنەگرە دڵسۆزەکان ، کە بەرامبەر ئەو چەند لیستەیەی تا کو ئیستا بلاوکراونەتەوە لیژنەیەکی پێك‌هێنا ؛ هەمو ئەو نامە و نوسراوانەیان لەبەر دەست دانان . ئەوانیش چەند رۆژ کاریان لەسەر کردن و هەڵیان سەنگاندن و بەراوردیان کردن . زۆر پێشنیاری رەخنەگرەکانیان پەسەند کرد و هەندێکیشیان بە دڵ نەبوون . لە پاشاندا ئەنجامی ئەم کارەی لیژنە خرایە بەردەم ئەنجومەن . ئەنجومەنیش دوای لێکۆڵینەوە و توێژینەوە توانی بە شێوەیەکی باشتر دوا بڕیاری خۆی لە بارەیانەوە بدات . بە وێنە لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا بەرامبەر بە « اخلاق »

نوسرابو « رەوشت » ، بەڵام کۆڕ پێشنیاری رەخنەگرانی پەسەند کرد و « ئاکار »ی بۆ « اخلاق » دانا . یاخود « شیرەمەنی ، سپیایی » بۆ « البان » دانرابون و « ریچاڵ » جێی گرتنەوە بۆ « ماشیة » ـ « گاڕان » بەکار هێنرا بو و کرا بە « وڵسات » . هتد[9]

گەلێك جار ئەنجومەن خۆی بەسەر کارەکانی خۆیدا دەچێتەوە و ئەگەر هەڵەیەك بوبێ و شتێکی بەسەردا تێپەڕیبێ راستی دەکاتەوە ، بە وێنە لە لیستەی ئەمجارەی زاراوی کۆڕدا ئەوە بەر چاو دەکەوێ کە هەندێ زاراو گۆڕاون ، وەك ئەوەی پێشنیاری زۆی بۆ « قدرة » ـ « هێز » بو ، بەڵام وای بە باش زانی کە بیکرێ بە « توانست » ، چونکە « هێز » بۆ « قوة » پتر دەگونجێ ..... هتد[10] .

تاکو ئێستا ، تێکڕایی ئەو زاراوانەی کۆڕ بڵاوی کردوەنەتەوە پێشنیارن ، بەڵام دوای لێکدانەوە و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی کاری رەخنەگران و بە سەراچونەوەی تێکڕایی زاراوەکان ، ئەوسا بە یەکجاری بڕیاریان لەسەر دەدرێ و بە گوێرەی بابەت بڵاودەکرێنەوە .

(٩) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ل ٨٨٠ ـ ٨٩٣ ؛ هەروەها کتێبی « زاراوی کارگێڕی » ، ل ١١٠ ـ ١٢٣ .

(١٠) لەم لیستەیەدا ، واتە ـ لە لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕدا ـ لەو جۆرە نمونانە زۆرن .

کۆڕ لە دانانی زاراوی کوردیدا بە زۆری پەنا دەباتە بەر زمانی کوردی و مایەی خۆشییە کە زمانەکەمان دەوڵەمەندە و توانراوە وشەی وەها بهێنرێنە کایەوە کە گەلێك لەبار و گونجاو بن و جێگەی زاراوی عەرەبی بە تەواوی بگرنەوە . بێگومان ئەگەر زاراوێك لە کوردیدا نەبێ و یاخود پڕ بە پێستی زاراوە عەرەبیەکە نەبێت ، ئەوسا یا هەر عەرەبیەکە وەردەگیرێ یاخود پەنا بۆ لاتینی دەبرێ و ئەمەش دیاردەیەکی واقعییە و لە گشت زمانێکی سەر زەمیندا رەچاو دەکرێ .

لیستەی ئەم جارەمان ، واتە ـ لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ـ لە سێ بەش پێکهاتوە :

١ـ زاراوی زمان .

٢ـ زاراوی کارگێڕی .

٣ـ زاراوی کتێبی فێرگەکان[11] .

سەرلەنوێ ئەوەش دەهێنینەوە یاد کە ئەم زاراوانە پێشنیارن و بۆیەکا تکا لە هەموو مامۆستا کوردە دڵسۆزەکان دەکەین ، کە هەر وەك لیستەی یەکەم و دووەم و سێیەمی بە وردی سەرنجیان بدەنێ و لێیان بکۆڵنەوە و بیری خۆیانمان پێ رابگەیەنن .

(١١) لە زاراوی کتێبی فێرگەکاندا ئەمجارە بەشی زاراوی زانستەکانی گشتی ( مصطلحات العلوم العامة ) بلاو دەکەینەوە .

## - لیستەی چوارەم -

## ١- زاراوی زمان

### - أ -

| زاراوی عەرەبی | زاراوی کوردی | تێبینی |
|---|---|---|
| الأتمام | تەواوکردن | |
| - للتمم | تەواوکەر | |
| - المتمم المباشر | تەواوکەری یەکسەر | |
| الأخباری | پەیامی | |
| الأداة | ئامراز | |
| - أداة الأتمام | ئامرازی تەواوکردن | |
| - أداة النداء | ئامرازی گاس کردن | |
| الأستفهام | پرس | |
| الاستقبال | ئاینده ، داهاتو | |
| الاسم | ناو | |
| - اسم الأشارة | راناوی نیشاندان | Demonstrative |
| - الاسم البسيط | ناوی ساده | |
| - اسم الجمع | ناوی کۆ | |
| - الاسم الجمعي | ناوی کۆمەڵ | |
| - الاسم الخاص | ناوی تایبەتی | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ اسم الذات | ناوى زات | |
| ـ الاسم العام | ناوى گشتى | |
| ـ اسم الفاعل | ناوى كارا | |
| ـ اسم الفعل | ناوى كار | |
| ـ الاسم المادي | ناوى مايه | |
| ـ الاسم المركب | ناوى لێكدراو | |
| ـ الاسم المشتق | ناوى داڕژاو ، ناوى دروستكراو | |
| ـ الاسم المعنوي | ناوى واتا | |
| ـ الاسم المفرد | ناوى تاك | |
| ـ اسم المفعول | ناوى بەركار | |
| ـ الاسم الموصول | راناوى پەيوەستى | Relative - Pronoun |
| ـ الاسماء المحايدة | ناوى بێجنس | |
| ـ الاسماء المذكرة | ناوى نێر | |
| ـ الاسماء المشتركة | ناوى دوجنس | |
| ـ الاسماء المؤنثة | ناوى مێ | |
| الأسنان | ددان | The teeth |
| ـ قاعدة الأسنان | بنى ددان | The roof of the mouth |
| الاشتقاق | داڕشتن | Derivation |
| الأصوات | دەنگەكان | نەك بە واتاى ( فۆنەتيك ) . |
| ـ علم الأصوات | زانستى دەنگ ، دەنگناسى . | Phonetics |

| | | |
|---|---|---|
| ـ الأصوات الانفجارية | دەنگی دەرباز | |
| الأمر | فەرمان | Command |
| اندغام حرفي علة | بزوێنی دوّلانە | Diphthongs |
| الأنشائي | ئینشائی | |
| الأوتار الصوتية | ژێی دەنگ | The Vocal Chords |
| الأيجاب | ئەرێ | |

- ب -

| | | |
|---|---|---|
| البدل | بریتی | |

- ت -

| | | |
|---|---|---|
| الترجي | خۆزێ | Supposition |
| التركيب الأضافي | لێکدانی ئیزافی | |
| الترميز والترقيم | خاڵبەندی | Punctuation |
| التشديد | گوشین ، گرتن | |
| التصريف | گەردان | Conjugation |
| التصغير | بچوّك كردنەوە | Diminutive |
| التلفظ | بێژە | Pronunciation |

لە « بێژان »ەوە هاتووە .

- ج -

| | | |
|---|---|---|
| الجمع | کۆ | Plural |

| | | |
|---|---|---|
| الجملة | رسته | Sentence<br>له ڕێزمانی ئینگلیزیدا Sentence ڕستەی تەواو سەربەخۆیە ، بەلام Clause ڕستەیەکە دەبێتە بەشێك یا پارچەیەك لە ڕستەیەکی گەورەتردا . لەبەر ئەوە وا بە باش دەزانین ، کە ( ڕستە ) بۆ ( Sentence ) و ( کلۆز ، بۆ ( Clause ) بەکاربێت . |
| ـ الجملة الاخبارية | رستەی خەبەری | |
| الجملة غير الرئيسة | كلۆز | Clause<br>بڕوانە : « الجملة » |
| ـ الجملة الاسمية | كلۆزی ناو | |
| ـ الجملة الظرفية | كلۆزی ئاوەڵکار | |
| ـ الجملة الوصفية | كلۆزی ئاوەڵناو | |
| الجملة الاستفهامية | رستەی پرس | Interrogative |
| ـ الجملة الأمرية | رستەی فەرمان | |
| الجملة الانشائية | رستەی ناخەبەری | |
| ـ الجملة البسيطة | رستەی ساكار | |
| ـ الجملة التابعة | پاژستە | « پاژستە » کورتکراوەی « پاژڕستە »یە بە واتای « پارچەڕستە » . سوان و نۆچۆنی پیت لە کوردیدا دەستورێکی باوە ، ئەنجومەن وای پەسندکرد ، بۆ ئەم زاراوەیە ئەم دەستورە بەکار بێنی و ببێتە هاوئاهەنگی « شاژستە » ـ کە بۆ « الجملة الرئيسة » دانراوە . |

| | | |
|---|---|---|
| ـ الجملة التامة | رستەی تەواو | |
| ـ الجملة التعجبية | رستەی سەیرەك | |
| ـ الجملة الخبرية | رستەی خەبەرێ | |
| ـ الجملة الرئيسيه | شارستە | |
| ـ الجملة الصغرى | رستۆك | |
| ـ الجملة الكبرى | رستەی گەورە | |
| ـ الجملة المثبتة | رستەی ئەرێی | |
| ـ الجملة المركبة | رستەی لێكدراو | |
| ـ الجملة المعترضة | رستەی ناواخن | |
| ـ الجملة المعقدة | رستە ئاوێتە | |
| ـ الجملة المنفية | رستەی نەرێی | |
| ـ الجملة الناقصة | رستەی كەل | |
| الجنس | جنس | |
| جهاز النطق | رشتەی ئاخاوتن | |
| الجواب | وەڵام | Answer |

## - ح -

| | | |
|---|---|---|
| الحاضر | نهۆ | Present |
| حافة السنخ | مەڵاشوی نەرم | |
| الحال | ئێستا | |
| الحال | بار | Manner |
| الحرف | پیت | Letter |

| | | |
|---|---|---|
| - الحروف الصحيحة | گیر | Consonants |
| - حروف العلة | بزوێن | Vowels<br>تێبینی : ( بزوێن ) له عـهرهبیدا (حروف العلة و حركات) دهگرێتهوه. |
| الحركة | بزوێنی كورت | |
| الحنجرة | ئهوك | |

- خ -

| | | |
|---|---|---|
| الخبر | پهیام | |
| الخيشوم | بۆشایی لوت | The Nasal Cavities |

- د -

| | | |
|---|---|---|
| الدراسات المقارنة | لێكۆڵینهوهی بهراوردی | لێرهدا وشـهی « لێكۆڵینهوه » كه بهرامبهر « دراسات » وهستا ، لهوه دهرچوو وانهی « فقـه » بگرێتهوه |

- ر -

| | | |
|---|---|---|
| الرئتان | سـی | The lung |

- ز -

| | | |
|---|---|---|
| الزمان | كات | |

- س -

| | | |
|---|---|---|
| السابقة | پێشگر | |
| السؤال | پرس | Question |

## - ش -

| | | |
|---|---|---|
| الشارحة | جۆتەخاڵ | Colon |
| الشرط | مەرج | Condition |
| الشرطة | داش | Dash |
| الشفة | لێو | The lips |

## - ص -

| | | |
|---|---|---|
| الصفة | ئاوەڵناو | Adjective |
| - الصفـــة الاستفهامية | ئاوەڵناوی پرس | |
| - الصفة الاشارية | ئاوەڵناوی نیشاندان | |
| - الصفة البسيطة | ئاوەڵناوی سادە | |
| - الصفة الترتيبية | ئاوەڵناوی ریزەك | |
| - الصفة الثابتة | ئاوەڵناوی ساكار | Positive |
| - الصفة العالية (الصفة التفضيلية) | ئاوەڵناوی باڵا | |
| - الصفة العددية (الأصلية) | ئاوەڵناوی ژمارەیی | |
| - الصفة الفاعلية | ئاوەڵناوی كارا | |
| - الصفة الكسرية | ئاوەڵناوی بڕكردن ، وەك : دوّ دوّ ، چوار چوار . ئاوەڵناوی دابەشكردن | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ الصفة الكمية غير المعدية | ئاوەڵناوی چەندێتی نەژمێر | |
| ـ الصفة الكمية المعينة (المعدية) | ئاوەڵناوی چەندێتی ژمێرە | |
| ـ الصفة المبهمة | ئاوەڵناوی بزر | |
| ـ الصفة المركبة | ئاوەڵناوی لێکدراو | |
| ـ الصفة المشبهة بالفعل | ئاوەڵناوی کارئاسا | |
| ـ الصفة المفعولية | ئاوەڵناوی بەکار | |
| ـ الصفة للمقارنة | ئاوەڵناوی بەراورد | Comparative |
| ـ الصفة الوصفية الخبرية (الثابتة) | ئاوەڵناوی وەسفی | |
| ـ مفاضلة الصفات (درجاتها) | پلەکانی ئاوەڵناو | |
| الصوت | دەنگ | |
| ـ الصوت اللغوي | فۆنێم | |
| الصياغة | ڕێژ | |
| ـ الصيغة | ڕێژە | |

## ـ ض ـ

| | | |
|---|---|---|
| الضمير | راناو | Pronoun<br>وشـەیەکە لە لایەن زۆربـەی نوسـەرانەوە بەکار هاتوە هەروەها بڕوانە : راپۆرتی ایژنەی زمان و زانستەکانی . |

| | | |
|---|---|---|
| الضمير المستتر | راناوی بزر | Mdden Pronoun |
| ـ الضمير المتصل | راناو لـكاو | |
| ـ الضمير المنفصل | راناوی جودا | |
| ـ الضمائر الاستفهامية | راناوی پرس | |
| ـ الضمائر الاشارية | راناوی نیشاندان | |
| ـ الضمائر التوكيدية | راناوی خۆیی | |
| ـ الضمائر الشخصية | راناوی کەسی | |
| ـ الضمائر المبهمة | راناوی بزر | |
| ـ الضمائر الملكية | راناوی هەیی | |
| ـ ضمائر الوصل | راناوی گەیەنەر | |

## ـ ط ـ

| | | |
|---|---|---|
| طرف اللسان | سەری زمان | The Tip of the Tongue |
| الطليق الثلاثي التركيب | بزوێنی سێلانە | Triphthong |

## ـ ظ ـ

| | | |
|---|---|---|
| الظرف | ئاوەڵکار | |
| ـ ظرف الزمان | ئاوەڵکاری کات | Adverbs of time |
| ـ ظرف المكان | ئاوەڵکاری جێ | Adverbs of place |

| | | |
|---|---|---|
| ـ ظرف الوصل | ئاوەڵکاری گەیەنەر | |
| ـ الظروف البسيطة | ئاوەڵکاری سادە | |
| ـ الظروف المركبة | ئاوەڵکاری لێکدراو | |

## - ع -

| | | |
|---|---|---|
| عالم الصوت | دەنگناس | Phonetician |
| عالم اللغة | زمانناس | Linguist |
| العبارة (العقدة) | فرێز | Phrase |
| العدد | ژمارە | Numeral |
| ـ العدد المركب | ژمارەی لێکدراو | Compound |
| عضو النطق | ئەندامی ئاخاوتن | |
| العطف | پەیوەندی | Connection |
| العقدة | فرێز | |
| ـ العقدة الاسمية | فرێزی ناو | |
| ـ العقدة الظرفية | فرێزی ئاوەڵکار | |
| ـ العقدة الوصفية | فرێزی ئاوەڵناو | |
| علامات التعدية | نیشانەی تێپەڕاندن | |
| علم أصل الكلمة وتاريخها | ئێتیمۆلۆژی | Etymology |
| علم الاصوات | زانستی دەنگ | |
| علم الصرف | مۆرفۆلۆژی | Morphology |

| | | |
|---|---|---|
| علم القواعد | ڕێزمان | وشەی « دەستۆر » بۆ تاك تاكە قاعیدەکانی ڕێزمان بەکار بێت ، وەك ( دەستۆری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ) . |
| علم اللغة التأريخي | زانستی مێژووی زمان | |
| علم النحو | زانستی ڕستەسازی | Syntax |

## - ف -

| | | |
|---|---|---|
| الفارزة | کۆما | Comma |
| الفاعل | کارا | Agent |
| الفعل | کار | Verb |
| ـ فعل الأمر | کاری فەرمان | |
| ـ الفعل البسيط | کاری سادە | |
| ـ الافعال الشاذة | کاری لاڕۆ | |
| ـ الفعل القياسي | کاری ڕاستڕەو | |
| ـ الفعل اللازم | کاری تێنەپەڕ | |
| ـ الفعل الماضي | کاری ڕابردوو | |
| ـ الفعل الماضي الاستمراري | کاری ڕابردووی بەردەوام | |
| ـ الفعل الماضي الالزامي (الانشائي) | کاری ڕابردووی ئینشائی | |
| ـ الفعل الماضي البسيط | کاری ڕابردووی ساکار | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ الفعل الماضي البعيد | كاری رابردوَی دوَر | |
| ـ الفعل الماضي التام | كاری رابردوَی تەواو | |
| ـ الفعل المبنى للمجهول | كاری كارا بزر | Passive Voice |
| ـ الفعل المبنى للمعلوم | كاری كارا دیار | Active Voice |
| ـ الفعل المتعدي | كاری تێپەڕ | |
| ـ الفعل المركب | كاری لێكدراو | Compound Verb |
| ـ الافعال المساعدة | كاری یاریدەر | |
| ـ الفعل المضارع | كاری ئێستا | |
| ـ ازمنة الفعل | كاتەكانی كار | |
| ـ جذر الفعل | رەگی كار | |
| ـ مشتقات الفعل | وەرگیراوەكانی كار | |

## ـ ق ـ

| | |
|---|---|
| القصبة الهوائية | بۆری هەوا |

## ـ ك ـ

| | |
|---|---|
| الكسور | كەرتە (كەرتە ژمارە) |
| الكلام المباشر | گوتەی یەكسەر |
| الكلام غير المباشر | گوتەی تیاز |

| | | |
|---|---|---|
| الـكلمة | وشـــه | |
| ـ الكلمة البسيطة | وشەی سـادە | |
| ـ الـكلمة المركبة | وشەی لێـكدراو | |
| ـ الـكلمة المشتقة | وشەی داڕژاو ، | |
| | وشەی دروست کراو . | |
| الـكمـي | چەندێتی | |

## ـ ل ـ

| | | |
|---|---|---|
| اللاحقة | پاشگر | |
| اللاصقة | گیرەك ، نوسەك | |
| ـ اللواصق الاسمية | گیرەکی ناو | |
| ـ اللواصق الظرفية | گیرەکی ئاوەڵـکار | |
| ـ اللواصق الفعلية | گیرەکی کار | |
| ـ اللواصق الوصفية | گیرەکی ئاوەڵناو | |
| اللثة | پووك | |
| اللسان | زمان | The Tongue |
| اللغة | زمان | |
| اللهاة | زمانە بچکۆلە | |
| الماضي | رابردو | Past |
| المبتدأ | سەرەتا | |
| المجهور | ئاوازە | Voiced |

بڕوانە : « المهموس » .

## - م -

| | | |
|---|---|---|
| المد | بزوێنی درێژ | Long Vowel |
| مزيد الوسط | ناوگر | |
| المورفيم | مۆرفێم | Morpheme |
| المركب | لێکدراو | |
| ـ المركب و المنحوت | لێکدراو و داتاشراو | بڕوانە : ( المنحوت ) . |
| المزيدات | گیرەك | Affixes |
| المسند | باڵدە | |
| المسند اليه | بەرباڵ | |
| المصدر | چاوگ | Infinitive |
| ـ المصدر البسيط | چاوگی سادە | |
| ـ المصدر المركب | چاوگی لێکدراو | |
| المعرفة | ناوی ناسراو | بڕوانە : « نكرة » |
| المفعول به | بەرکار | Object |
| المقام الصوتي | پێچ | Pitch<br>ماوەی نیوان دۆ کۆنسۆنانتە . |
| المقطع | بڕگە | |
| ـ المقطع الطويل | بڕگەی درێژ | |
| ـ المقطع القصير | بڕگەی کورت | |
| المكان | جێ | |

| | | |
|---|---|---|
| المنحوت | داتاشراو | بڕوانە : « للمركب » . |
| المهموس | کپ | Voiceless<br>بڕوانە « : « للمجهور » . |

## - ن -

| | | |
|---|---|---|
| نائب الفاعل | جێگری کارا | بەکوێرەی شوێنی وشە لە رستەدا ، نەك لە رووی واتاوە. |
| النبرة | هێز | Stress |
| النداء | گاس کردن | Vocation |
| نصف الطليق | سابزوێن | Semi - Vowels |
| النفي | نەرێی | |
| النقطة | خاڵ | Full Stop |
| النقطة ( فوق الحروف ) | خاڵ | |
| النقطة (علامة الصفر في الرياضيات ) | سفر | |
| نقطة الاتصال | جەمسەر | Juncture |
| النكرة | ناوی نەناسراو | بڕوانە : « للمعرفة » . |

## - و -

| | | |
|---|---|---|
| الوحدة الصوتية | فۆنێم | Phoneme |

* * * * * *

# ٢- زاراوی کارگێڕی

## - أ -

| زاراوی عەرەبی | زاراوی کوردی | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| ابناء | رۆڵە | |
| - ابناء القومية العربيه | رۆڵـەی نەتەوەی عەرەب | |
| - ابناء المنطقة | رۆڵەی ناوچە | |
| اتاوه | هەستە | دەمێکە بۆ ئـەم مانـایە بەکار دەهێنرێـت . لەو تێـکستـانەی نووسکاران تۆماری کردون بەرچاو دەکەوێ . هەروەهـا بڕوانـە : « رسوم »و « ضريبة » . |
| آثار قانونية | شوێنەواری یاسایی | |
| اجرة | کرێ | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی حکوم . |
| - اجرة مقطوعة | وشکەمز | |
| الاحصاء العام | ئەژماری گشتی | |
| الأحوال المدنية | باری ژیار | |
| الادارة المحلية | گێڕانی ناوخۆیی | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی حکوم . |
| ارتباط | پەیوەندی | |
| الارض البكر ( ذات قابلية جيدة للزراعة ) | کۆدە | |

| | | |
|---|---|---|
| الارض الزراعية | كێڵگه | |
| الارض الزراعية المتروكة | بۆره | |
| الارض قليلة الخصب (غير مزروعة) | بەیار | |
| استقالة | وازهێنان | |
| استهلاك | تێچوون | هەرچەندە لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا « تێبوون » بەرامبەر بە « استهلاك » دانراوە ، بەلام « تێچوون » راستترە . |
| اصدار | دەرچواندن | |
| اصرار | سووربوون | |
| الاصلاح الزراعي | زەوی سازی | |
| ـ حصة الاصلاح الزراعي | پشکی زەوی سازی | |
| اعادة النظر | چاوپێدا گێڕانەوە | |
| اعفاء | جەبدان | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ ؛ هەروەها فەرهەنگەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی ل ٢١ . |
| الاقتراع السري | رادانی نهێنی | |
| اقرار ( تثبيت ) | چەسپاندن | |
| اقرار ( اعتراف ) | دان پێدانان | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| الاقسام الادارية | بەشەکانی کارگێڕی | بڕوانە : « التقسيمات الادارية » . |

| | | |
|---|---|---|
| الأقليات | کەمایەتیێکان | |
| التزام | دەربەستی | |
| ـ ملتزم | دەربەست | |
| الامة | نەتەوە | |
| الامور الجارية | کاروباری رۆژ | |
| ـ تصريف الامور الجارية | رەواندنی کاروباری رۆژ | |
| امين السر | رازگر | بڕوانە : لیستەی یەکەی زاراوەکانی کۆڕ . |
| انتداب | راسپاردە | |
| ـ منتدب | سپاردە | |
| انتفاء | نەمان | |
| انعقاد | بەستران | |
| الاوقاف | ئەوقاف | |

## ـ ب ـ

| | | |
|---|---|---|
| بالنسبة | لەپێر | لە ناوچەی بادینان بەکاری دەهێنن. بە وێنە دەڵێن : « ئەڤ کتێبە بێر کتێبە هانێ بجوانترە » . |
| بالولادة | زکماك | |
| ـ من ابوين عراقيين بالولادة | لە دایك و باوکێکی عێراقی زکماك | |
| البلديات | شارەوانی | |

| | | |
|---|---|---|
| بيان ١١ آذار | بەیانی یازەی ئازار | بڕوانە : « منشور » ، کە « بەیاننامە »ی بۆ دانراوە . |

## ـ ت ـ

| | | |
|---|---|---|
| تحديـد الطبيعـة القومية | دەرخستنی رسکانی نەتەوایەتی | |
| تدقيق | وردبونەوە | |
| تسجيل السيارات | تۆمارکردنی ئۆتۆمۆبێل | |
| التشكيلات | پێـکهاتووەکان | |
| تعارض | دژایەتی | |
| تعديل | هەموار | |
| التعليم | خوێندن | |
| ـ التعليم الالزامي | خوێندنی ئەوزیمی | بڕوانە : تۆفیق وەهبی ، ل ١٤٦ ، « ئەوزیم »ی بۆ « الزام » داناوە. |
| ـ التعليم العالي | خوێندنی بەرز | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ |
| تعليمات | رێنوێنی | |
| التفتيش المالي | پشکنینی دارایی | بڕوانە : « تفتيش » و « مالية » ، کە لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا «پشکنین» و « دارایی »یان بۆ دانراوە . |
| التقاليد | نەریت | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ |
| التقسيمات الادارية | دابەشینی کارگێری | بڕوانە : « الاقسام الادارية » |

| | | |
|---|---|---|
| تنسيق | ڕێك كردن | |
| الثقة | بڕوا | |
| ـ سحب الثقة | كێشانەوەی بڕوا | |
| ـ طرح الثقة | خستنەڕوی بڕوا | |

## - ج -

| | | |
|---|---|---|
| الجهات المركزية | لایەنەكانی ناوەندی | |
| المختصة | بەرپرس | |

## - ح -

| | | |
|---|---|---|
| الحاصل | دەرامەت | بڕوانە : «انتاج» و «موارد» . |
| حريات | ئازادی | |
| الحسابات الختامية | هەژماری دوایەكی | |
| حق | ماف | |
| ـ حق الاختيار | مافی هەڵبژاردن | |
| الحكم | بەرەڤان | بڕوانە : لیستەی یەكەمی زاراوەكانی كۆڕ . |
| ـ الحكم المركزي | بەرەڤانی ناوەندی | |
| الحكم الذاتي | ئۆتۆنۆمی | |
| ـ أسس الحكم الذاتي | بنجەكانی ئۆتۆنۆمی | |
| ـ هيئات الحكم الذاتي | دەستەی ئۆتۆنۆمی | |

| | | |
|---|---|---|
| حل | هەڵوەشاندن | |
| ـ حل المجلس | هەڵوەشاندنی ئەنجومەن | |
| ـ منحل | هەڵوەشاو | |
| حماية | پاراستن | |

## - خ -

| | | |
|---|---|---|
| خدمة | خزمەت | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| ـ اجور الخدمات | مزی خزمەت | |
| الخصائص | تایبەتێیکان | |
| الخطة التفصيلية | پلانی وردکار ، پلانی دور و درێژ | |
| خطة التنمية القومية | پلانی فراژوکردنی نەتەوایەتی | |

## - د -

| | | |
|---|---|---|
| الدفاع للمدنى | بەرگرتی سویل | |
| دولة | کیشوەر | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| ديوان | دیوان | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| ـ ديوان الرقابة المالية | دیوانی سەرانسۆپی | |

## - ذ -

| | | |
|---|---|---|
| ذات الطابع | ئامالٌ | |
| - ذات الطابـع المحلي | خۆماڵی | |

## - ر -

| | | |
|---|---|---|
| الرسوم (كضريبة) | فەرمانە | بڕوانە : « ضريبة » و « اتاوة » . هەروەها بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| - رسوم تسجيل العقار | فەرمانەی تۆمار کردنی ئاقار | |
| - رسوم المحاكم | فەرمانەی دادگە | |
| الرقابة | سەرانسۆیی | |
| - ديوان الرقابة المالية | دیوانی سەرانسۆیی دارایی . | |

## - س -

| | |
|---|---|
| سؤال | پرس ، پرسینەوە |
| السياسة التربوية | سیاسەتی پەروەردە کردن |
| السياسة التعليمية | سیاسەتی فێرکردن |

## - ش -

| | |
|---|---|
| شخصية معنوية | کەسێتی مانایی |

| | | |
|---|---|---|
| شرف | شەرەف | ئەم وشـەیە بە تەواوی لە زمانی کوردیدا جێگەی خۆی کردۆتەوە و هەروەها بنجێکی کۆنی هەیە . |
| الشعب | گەل | |

## ـ ص ـ

| | | |
|---|---|---|
| صلاحية | دەسەڵات | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |

## ـ ض ـ

| | | |
|---|---|---|
| ضريبة | باج | بڕوانە : « رسوم » و « اتاوة » . |
| ـ ضريبة الارض | زەویانە | |
| ـ ضريبة الارض الزراعية | باجی کێڵگە | |
| ـ ضريبة التركيات | میراتانە | |
| ـ ضريبةالعرصات | کاولانە | |
| ـ ضريبة العقار | ئاقارانە | |
| ـ ضريبة العقار الاساسية | ئاقارانەی بنجق | |
| ـ ضريبة العقار الاضافية | ئاقارانەی سەرەنیا | |

## ـ ط ـ

| | | |
|---|---|---|
| طعن | توانج | |
| ـ طاعن | توانج کر | |

| | | |
|---|---|---|
| الطوابع | پوول | |
| ـ الطوابع المالية | پولی دارایی | |

## ـ ع ـ

| | | |
|---|---|---|
| عدالة | داد | |
| علني | ئاشکرا | |
| عنصر ( اصل ) | ماك ، سەرچاوە | |

## ـ غ ـ

| | | |
|---|---|---|
| غرامات | تاوانه | بڕوانه : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |

## ـ ف ـ

| | | |
|---|---|---|
| فصل ( النزاع ) | بڕینەوە | هەرچەنـده « جیاکردنەوە » و « لێك کردنەوە » هەیە ، بەلام مانای تەواوی « فصل » نادەن . هەرچی « هەڵبڕینەوە »یە باشـتر ئەو مانایە دەبەخشێ ، وە کورتەی ئەم وشەیەش « بڕینەوە »یە و بۆ زاراو لەبارترە . |

## ـ ق ـ

| | | |
|---|---|---|
| القضاء | داوەری | |
| قطعية | یەکجاری | |
| قيود احصاء | تۆمار | |

## - ل -

| | | |
|---|---|---|
| اللغة الام | زمانی زگماك | |
| لغة رسمية | زمانی میری | |

## - م -

| | | |
|---|---|---|
| المادة | ماده | |
| مبادیء (اسس) | بنچینه | |
| مبادیء (اولیات) | سەرەتا | |
| متتالية | دوابەدوا | |
| - مرتين متتالية | دوَجاری دوابەدوا | |
| المجلس | ئەنجومەن | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کوَڕ . |
| - المجلس التشريعي | ئەنجومەنی یاسا کاری | |
| - المجلس التنفيذي | ئەنجومەنی راپەڕاندن | |
| المحلي | ناوخۆ | |
| مخول | دەسەڵات پێدراو | لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کوَڕدا، بڕوانە : تخويل الصلاحيات » . |
| المرافق التعليمية | دەزگاکانی خوێندن | |
| المرافق الاجتماعية | دەزگای کۆمەڵایەتی | |
| المرافق الثقافية | دەزگای روَشنبیری | |
| المرافق العمرانية | دەزگای ئاوەدانی | |

| | | |
|---|---|---|
| مرسوم | فەرمایشت | |
| ـ مرسوم جمهوري | فەرمایشتی کۆماری | |
| مركز ( مؤسسة ) | بنکە | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ |
| مركز اداره | بنکەی کارگێڕی | |
| مساءلة | لێ پرسین | |
| مشاورة | راوێژ | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| المصالح | بەرژەوەند | |
| ـ المصالح الانتاجية | بەرژەوەندەکانی بەرهەمی | |
| المطلقة | رەها | |
| معتقد | بیروبڕوا | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ ، کە « بڕوا » بۆ « ثقة » ، وە «باوەڕ» بۆ « عقیدة» دانراون . |
| مقاول | بەڵێندەر | بڕوانە : « ملتزم » . |
| مكتب | مەکتەب | |
| ـ مكتب المتابعة والتفتيش | مەکتەبی هێکاری و پشکنین | |
| ـ مكتب الاحصاء والتخطيط | مەکتەبی ئەژمار و پلان دانان | |
| ملتزم | دەستەبەر | بڕوانە : « مقاول » . |
| ملغات | هەڵوەشاو | لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا ، بڕوانە : « الفاء » . |

| | | |
|---|---|---|
| ممارسة | بەکارهێنان | |
| مناقشة | لێدوان | |
| منتسب | سەر بە | |
| منطقة | ناوچە | |
| ـ منطقة كردستان | ناوچەی کوردستان | |
| المنهاج الاستثماري | بەرنامەی بەرهەمی | |
| مورد (موارد) | داهات | |
| ميزانية | بوجە | بڕوانە : لیستەی دووەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| ـ الميزانية الاستثمارية | بوجەی بەرهەمی | |
| ـ الميزانية الاعتيادية | بوجەی ئاسایی | |
| ـ الميزانية الخاصة | بوجەی تایبەتی | |
| ـ الميزانية الموحدة | بوجەی یەکخراو | |

ـ ن ـ

| | | |
|---|---|---|
| نصاب | رادە | |
| نظام (كمصطلح قانوني) | پێڕەو | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| نقل الملكية | گواستنەوەی خاوەنی | |

| | |
|---|---|
| النمو و التطور | فراژو و گۆڕان |

- و -

| | |
|---|---|
| وحدة ادارية وحدة | یەك پارچەیی کارگێڕی |
| الوحدة الاقتصادية | یەکەتی ئابوری |
| الوحدة السياسية | یەکەتی سیاسی |
| الوحدة القانونية | یەکەتی یاسایی |
| وحدة مالية | یەکەتی دارایی |

* * * * *

# ٣- زاراوی کتێبی فێرگەکان

## - أ -

| زاراوی عەرەبی | زاراوی کوردی | تێبینی |
|---|---|---|
| ابادة | فەوتاندن | |
| ابتدائي | سەرەتایی | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| اتباع | پەیڕەوی کردن | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ، بڕوانە : کۆڤاری «پەروەردە و زانست» ، ژ ٧ – ٨ ، ل ٥ . |
| اتجاه | سەمت | بڕوانە : لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆز . |
| اتحاد (اندماجي) | یەك بوون | |
| اتحاد(غير اندماجي) | یەك گرتن | |
| ارتخاء | شل‌بوون | |
| اتقاد | داگیرسان | بڕوانە : « اشتمال » . |
| اتلاف | لەناو بردن | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| الآثار القديمة | کۆنینە | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆز . |
| - عالم الآثار القديمة | کۆنەناس | |

## ٣- زاراوی کتێبی فێرگەکان

### ـ أ ـ

| زاراوی عەرەبی | زاراوی کوردی | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| ابادة | فەوتاندن | |
| ابتدائي | سەرەتایی | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| اتباع | پەیڕەوی کردن | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ، بڕوانە : کۆڤاری «پەروەردە و زانست» ، ژ ٧ ـ ٨ ، ل ٥ . |
| اتجاه | سەمت | بڕوانە : لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| اتحاد (اندماجي) | یەك بوون | |
| اتحاد (غير اندماجي) | یەك گرتن | |
| ارتخاء | شل بوون | |
| اتقاد | داگیرسان | بڕوانە : « اشتعال » . |
| اتلاف | لەناو بردن | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| الآثار القديمة | کۆنینە | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| ـ عالم الآثار القديمة | کۆنەناس | |

| | | |
|---|---|---|
| ـ علم الآثار القديمة | كۆنەناسی | ئەگەر بوترێ : « كۆنینەناسی » ئەوە كۆبوونەوەی سێ ( ن ) دەربڕینی زەحمەتە . |
| اثبات | چەسپاندن | بڕوانە : لیستەی یەكەمی زاراوەكانی كۆڕ . |
| اجنبي | بیانی | بڕوانە : لیستەی یەكەمی زاراوەكانی كۆڕ . |
| اجهاد | ئەرك | |
| احتكاك | لێكخشان | |
| احتياط | یەدەك | بڕوانە : لیستەی یەكەمی زاراوەكانی كۆڕ . |
| ـ احتياطي | یەدەكی | |
| احساس | هەست | |
| احمر | سوور | |
| ـ احمرار | سووربوونەوە | بڕوانە : لیستەی سێیەمی زاراوەكانی كۆڕ . |
| ـ احمر غامق | سووری تۆخ | |
| ـ احمر قاتم | ئاڵ | |
| اختراع | داهێنان | بڕوانە : لیستەی یەكەمی زاراوەكانی كۆڕ . |
| اختناق | خنكان | |
| اخدود | قەڵشت | |
| ارتطام | هەڵنكفتن ، هەڵنكوتن | لە كتێبی فێرگەكاندا هەمان وشە بەكار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ـ ٨ ، ل ٦ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| ارصاد | روانین | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » . ز ٧ ـ ٨ ، ل ٦ ) . |
| ارضة | مۆرانە | |
| ازمة | تەنگانە | هەرچەندە « تەنگ و چەڵەمە » بۆ « ازمة » پڕ بە پێستی خۆیەتی ، بەلام « تەنگانە » بۆ زاراو لەبارترە . |
| استحداث | نۆژەن کردن | |
| ـ مستحدث | نۆژەن | |
| استقرار | دامەزران | بە وێنە لە کوردەواریدا دەڵێن : « فلان خێڵ لە « لان شوێن دامەزرا » . جگە لە « دامەزران » وشەی « دامرکان »یش هەیە ، بەلام ئەمیان بۆ مەبەستی دیکەش بەکار دەهێنرێ . بە تایبەتی بۆ ( دامرکاندنەوەی ئاگر ـ کوژانەوە). |
| استکشاف | دۆزینەوە | |
| ـ استکشاف جغرافي | دۆزینەوەی جوگرافیایی | لە لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا ، بڕوانە : « جغرافية » . |
| استمرارية ( الحركة ) | بین گرتن | لە کوردەواریدا دەڵێن : « میزراحەکە بینی گرت » . هەروەها لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ز ٧ ـ ٨ . ل ٧ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| استنشاق | هەڵمژین | بڕوانە : لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ . هەروەها لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ز ۷ ــ ۸ ، ل ۸ ) . |
| اسفنج | ئەسفەنج | |
| اشتمال | گڕگرتن ، گڕبەستن | بڕوانە : « اتقاد » . |
| إشعاع | دانەوە | مامۆستا کەمال جەلال غەریب لە « فەرهەنگی زانیاری »دا هەمان زاراوی بەکار هێناوە . |
| ـ اشعاع الحرارة | تین دانەوە | |
| ـ اشعاع الضوء | تیشك دانەوە | |
| اصطناعي | دەستکرد | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ز ۷ ــ ۸ ، ل ۸ ) . |
| إضراب | مانگرتن | |
| ـ مضرب | مانگر | |
| اضطراب | شێوان | |
| اطار | هەیکەل | |
| إطار ( چرچوبة ) | چوارچێوە | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ز ۷ ــ ۸ ، ل ۸ ) . |
| اطار ( السيارة ) | تایە | |
| اعتدال | هێدی | |
| أعماق | ناخ | |

| | | |
|---|---|---|
| أفقي (للجغرافية) | ئاسۆیی | |
| آلة | ئامێر | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| ـ آلة التشريح | ئامێری توێکەر | |
| ـ آلة الخضاض | ئامێری ژەنەك | |
| ـ آلة العصر | ئامێری گوشەك | |
| ـ آلة الكبس | ئامێری پەستێو | |
| ـ آلة موسيقية | ئامێری مۆسیقا | |
| التهاب | داگیرسان | لە لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕدا چەند وشەیەك بەرامبەر بە « التهاب » دانراون ، بەلاّم ئەنجومەن هاتە سەر ئەو رایە کە تەنها « داگیرسان » بۆ « التهاب » بەکار بهێنرێت . |
| التواء (عضو الجسم) | بادران | |
| ألتواءات (جغرافية) | گەوەك | |
| ألم | ئێش | |
| ألياف صناعية | ریشاڵە دەستکردەکان | لە کتێبی فیزیکەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ــ ٨ ، ل ١٠ ) . |
| امتصاص | مژین | لە کتێبی فیزلەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ــ ٨ ، ل ١٠ ) . |
| امتياز (للتفوق) | بەرچاو | |

| | | |
|---|---|---|
| امتياز ( الجريدة ، الشركة ) | ودم | دەڵێن : « ودی وەرگرت .. » . ماموستا توفیق وەهبیش لە فەرهەنگەکەیدا هەر بۆ ئەو مەبەستەی بەکار هێناوە . |
| انـاء | دەفر | لە موکریان بۆ هەمو جۆرە « اناء »ێك بەکاری دەهێنن . |
| انـاطة | ( پێ ) سپاردن | |
| انبساط ( جغرافية ) | ساکار | |
| ـ ارض منبسطة | زەوی ساکار | |
| انبساط ( فل ) | خاوبونەوە | |
| انبساط ( انذياح ) | پانبونەوە | |
| أنبوب | لولە | |
| ـ الانبوب الجانبي | لولەی تەنیشت | |
| ـ انبوب الحفر | لولەی هەڵکەندن | |
| إنتاج | بەرهەم | |
| ـ انتاج سنوي | بەرهەمی ساڵانە | |
| انتشار | بڵاوبونەوە | |
| انتفاخ ( طبي ) | باکردن | بڕوانە : « التورم » ، کە « ئاوسان »ی بۆ دانراوە . |
| انتقال الصوت | دەنگ ڕۆیین | لە کتێبی فێرکەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ـ ٨ ، ل ١٠ ) . |
| انجراف ( التربة ) | داشڵاران | |

| | | |
|---|---|---|
| انحراف ( انهيار ) | جەین | هەروەها « جە » بەرامبەر « منهار » ، وە « دەجێ » بەرامبەر بە « انهار ، ینهار » دەوەستێ . |
| انحلال | داڕزان | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ــ ٨ ، ل ١١ ) . |
| انزلاق | خلیسکان | |
| انسان | مرۆڤ | |
| انصهار | توانەوە | |
| انضغاط | پەستران | |
| انطفاء | کوژانەوە | |
| انعدام | نەمان | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ــ ٨ ، ل ١١ ) |
| انعكاس الصوت | دەنگ دانەوە | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ژ ٧ ــ ٨ ، ل ١١ ) . |
| انفجار | تەقین | |
| انفكاك (عن الوظيفة) | ترازان | بڕوانە : لیستەی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| انفكاك ( تفكك ) | هەڵوەشان | لە کتێبی فێرگەکاندا هەمان وشە بەکار هێنراوە ( « پەروەردە و زانست » ، ٧ ــ ٨ ، ل ١١ ) . |

| | | |
|---|---|---|
| انقراض | بنەبـڕتی | بڕوانە : لیستەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕ . |
| ـ منقرض | بنەبڕ | |

## ـ ت ـ

| | | |
|---|---|---|
| تیـار | لوزەو | لە نـاوچەی موکریان دەڵێـن : « لوزەوی ئاوێ » |

## ـ ح ـ

| | | |
|---|---|---|
| حجز (المكان) | قۆرخ کردن | بڕوانە : ل ١١٧ی فەرهەنگەکەی مامۆستا تۆفیق وەهبی . |
| حركة | جوڵە | |
| ـ محرك | بزوێن | |

## ـ ص ـ

| | | |
|---|---|---|
| صحي | سازگار | |
| ـ غير صحي | ناساز | |

## ـ ط ـ

| | | |
|---|---|---|
| طاقة | وزە | |

## ـ ق ـ

| | | |
|---|---|---|
| قدرة | توانست | هـەرچەندە لە لیسـتەی یـەکەمی زاراوەکانی کۆڕدا بەرامبەر بە « قدرة » ـ « هێز » دانراوە ، بەلاّم « هێز » پـتر بۆ « قـوة » دەگونجێ . بڕوانە : « قوة » . |
| قـوة | هێـز | |

- م -

| | |
|---|---|
| مضيق | دەربەند |
| مقاومة | بەرگە |

- و -

وادي ( بين الجبلين ) دۆڵ

* * * * * *